مەبەستی تاڵەبانی لە پلینۆمەکەی نمایشی سیاسی، عەسکەری، نەفسی‌یە. . .
بۆ سازدانی هەمو هێز و توانای خۆی و یەکیتی و داوودەزگا حکومەتیەکان، دژی بزوتنەوەی گۆڕان. لە بەر ئەوەی خۆی سەرکۆماری عێراقە و لە هەمان کات دا سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانی و فەرماندەی گشتی پێشمەرگەکانی و بەرپرسی یەکەمی دەزگاکانی زانیاری و هەواڵگری و ئاسایشە، حیزبەکەشی هاوبەشی حکومەتی ناوەندیی بەغداد و حکومەتی هەرێمی کوردستانە، ئەبێ راپۆرتەکەی بە هەڕەشەیەکی جدی وەربگیرێ.
مرۆڤ ئەبێ بپرسێت:
ئایا ئەو لێشاوی تیرۆر و تۆقاندن و هەڕەشانەی لەدوای پلینۆمەوە بۆ سەر لایەنگران و هەڵسوڕاوانی گۆڕان دەستی پێ کردوە، پەیوەندی بەم قسە و تۆمەتانەوە نیە کە تاڵەبانی بۆ بزوتنەوەی گۆڕانی هەڵئەبەستێت؟
ئایا ئەو تۆمەتانەی تاڵەبانی بۆ بزوتنەوەی گۆڕانی ریز ئەکات، هەڵکردنی چرای سەوز نیە بۆ ئەو دەستدرێژییانەی لە دوای پلینۆمەوە کراوەتە سەر لایەنگر و هەڵسوڕاوانی گۆڕان؟
ناساندنی بزوتنەوەی گۆڕان و هەڵسوڕاوەکانی لە لایەن تاڵەبانیەوە، بە خەتەر بۆ سەر کوردایەتی، هەرێمی کوردستان، فیدرالیزم، دیمۆکراسی، پێشمەرگە، کەرکوك و دانانی بە دوژمنی یەکێتی و کورد و کوردستان خۆشکردنی زەمینەیە بۆ پاکتاوی جەستەیی بزوتنەوەکە و هەڵسوڕاوەکانی.
بۆیە لەدوای ئەم راپۆرتەوە کە بەشێوەیەکی فەرمی لەلایەن راگەیاندنی یەکێتیەوە بڵاو کراوەتەوە، ئۆباڵی هەمو روداوێکی ناخۆش و قەوماوێکی نەویستراو ئەکەوێتە ئەستۆی تاڵەبانی و یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان و ئەوان بەرپرسیاری سەرەکی هەمو پاشهاتەکانی ئەبن.